شێرپەنجەی پرۆستات Prostate cancer

وەرگێڕان و ڕێکخستنی لە زمانی هۆڵەندییە
گوڵاڵە پشدەری

بەسەرداچوونەوە:

دکتۆر ئازاد مەنتک

بڵاوکراوەی سەنتەری پەنا بە سپۆنسەری فەرمانگەی ڕێکخراوە ناحکومیەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان

2013

سوپاس و پێزانین بۆ ئەرکی بەسەرداچوونەوە:
د.ئازاد مەنتک، پسپۆڕی نەخۆشییەکانی دڵ و هەناو، سەرۆکی دەزگای دیدەوان بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری دروستی.

پێرست

- ناوەرک
- پرۆستات چییە؟
- کار یان ڕۆڵی پرۆستات چییە؟
- نەخۆشییەکانی پرۆستات:هەوکردن، ئازار و گەورەبوون
- نیشانەکانی کێشەی پرۆستات
- شێرپەنجە چییە (بە کورتی)
- شێرپەنجەی پرۆستات
- نیشانەکان
- هۆکارەکان
- پشکنین و ڕێگەکانی دەستنیشانکردنی شێرپەنجەی پرۆستات
- چارەسەرییەکان: نەشتەرگەری، دەرمان، چارەسەری بە ڕادیۆتراپی، کیمیایی،هۆرمۆنەکان
- شێرپەنجەی پرۆستات و سێکس
- دواکێشەکانی چاسەری کیمیایی
- زانست و چارەسەری نوێ بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات
- ڕەچاوکردنی ئەو خاڵانە کە پەیوەستن بە کێشەی میزکردن
- شێوەی ژیان و خۆراک
- زارگووتە چەوتەکان
- سەرچاوە

**پێشەکی:**
بە ڕێگەی ئەم نامیلکەیە دەمانەوێت، هەندێک زانیاری پێویست لە سەر پڕۆستات و نەخۆشییەکانی بە گشتی و نەخۆشی شێرپەنجەی پڕۆستات بە تایبەت ئاراستەی خوێنەران بکەین.
لە ئاماری ڕیکخراوی WHO(International Agency for research on cancer &the globocan project 2008) دا کە لە ساڵی ٢٠٠٨دا دەستنیشان کراوە ساڵانە بە ڕێژەی ١٢،٧ ملیۆن کەس تووشی شێرپەنجە دەبن. لە نێوان پیاواندا ڕێژەکەی٦،٦ ملیۆن و لە نێوان ئافرەتاندا ٦،٠ ملیۆن تووشبووە. چاوەڕێ دەکرێت ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ٢٠٣٠دا بگاتە ٢١ ملیۆن کەس.
هەروەها ساڵانە نزیکەی ٦،٧ ملیۆن کەس لە جیهاندا بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی دەکەن. ئەم ڕێژەیە چاوڕوان دەکرێت کە لە ساڵی ٢٠٣٠ دا بگاتە ١٢ ملیۆن کەس

لێرەدا چۆنییەتی پەیدابوونی کێشەکانی پڕۆستات، ڕۆڵی پڕۆستات چییە و شێرپەنجەی پڕۆستات، نیشانەکان،هۆکارەکان، پشکنینەکان و چارەسەرییەکانی جۆراوجۆر و شیوەی ژیانی تەندروست ڕوون دەکرێنەوە. لە سەرەتادا باس لە چەند نەخۆشییەکی پڕۆستات دەکرێت کە کێشەکە شێرپەنجە نییە و ئینجا باسی شێرپەنجەی پڕۆستات دەکرێت.چۆنکە نیشانەکانیان هاوشێوەی شێرپەنجەی پڕۆستاتن،ئینجا بۆیە بە پێویستمان زانی بۆ زانیاری زیاتر و نەکەوتنە ناو گوومان پێش باسکردنی شێرپەنجەی پڕۆستات ئاماژە بەم نەخۆشییانەی تری پڕۆستات بکرێت.

سەنتەری پەنا، بۆ پشتیوانی لە تووشبووان بە شێرپەنجە لە کوردستان پێیوایە کە بە ڕێگەی بەخشینی هۆشیاری تەندروستی لەسەر شێرپەنجە و شێوازی ژیانی تەندروست، مرۆڤ دەتوانێت تا ڕادەیەک پێش بە تووشبوون بە شێرپەنجە بگرێت یاخود ئەگەر مرۆڤ بە نیشانەکانی ئاشنا بوو، ئەو دەتوانێت بە کاتی خۆی هەڵوێستە وەرگرێت و بە دوای چارەسەریدا بگەڕێت یان بە ئەزموون و هەگبەی ئەو زانیارییەی کە هەیەتی باشتر دەتوانێت کەسانی دەورووبەری خۆی هۆشیار بکاتەوە لە خۆپاراستن و ئەگەری تووشبوون بە شێرپەنجە.
بە گوێرەی ئاماری ساڵی ٢٠٠٨ ساڵآنە نزیکەی ١٢،٧ ملیۆن کەس تووشی شێرپەنجە دەبن و لە نێوان پیاواندا ڕێژەکەی٦،٦ ملیۆن و لە نێوان ئافرەتاندا ٦،٠ ملیۆن تووشبووە. چاوەڕێ دەکرێت ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ٢٠٣٠دا بگاتە ٢١ ملیۆن کەس.
ساڵانە نزیکەی ٦،٧ ملیۆن کەس لە جیهاندا بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی دەکەن. چاوڕوان دەکرێت کە ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ٢٠٣٠ دا بگاتە ١٢ ملیۆن کەس.
هەروەها چۆنییەتی مامەڵەکردن لە گەڵ نەخۆشی شێرپەنجە ئاسان نییە، چۆنکە ئەم نەخۆشییە نە تەنیا گۆڕانکاری جەستەیی بەڵکو دەروونی و کۆمەڵایەتیشی پێوەیە. بۆ نموونە ئەم هەستەی ترس و دڵەڕاوکێیەی کە تووشبوو بە شێرپەنجەی هەیەتی کاریگەری دەخاتە سەر لای کۆمەڵایەتیشی.ئەم سێ گۆشەیە کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری شێرپەنجە لە زۆربەی حاڵەتدا هاوسەنگی لە دەست ئەدات و کەسی تووشبوو دەکەوێتە ناو بارودۆخێکی دژوار.

(٥ ) جۆرە هەرە زیاترین نەخۆشی شێرپەجە لە جیهاندا:




Aantal sterfgevallen per kankersoort per jaar x 1.000. Bron: WHO, 2009

رێژەی کۆچ و جۆری شێرپەنجە بە گوێرەی ڕاپۆرتی who ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە ساڵی ٢٠٠٩دا:

- شێرپەنجەی سییەکان ١٣٠٠
- شێرپەنجەی گەدە ٨٠٣
- شێرپەنجەی ڕیخۆڵە ٦٣٩
- شێرپەنجەی جگەر ٦١٠
- شێرپەنجەی مەمک ٥١٩

زیاترین ٣ جۆرە شێرپەنجە کەی کە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دا پێش دێن




**پیاوان:**

- شێرپەنجەی سییەکان ١٧%
- شێرپەنجەی گەدە ١٣%
- شێرپەنجەی جگەر ١٢ %
- شێرپەنجەکانی تر ٥٨%

**ئافرەتان:**

- شێرپەنجەی مەمک ٢٠%
- شێرپەنجەی دەروازەی منداڵدان ١٣%
- شێرپەنجەی سییە ٨%
- شێرپەنجەکانی تر ٥٩%

زیاترین ٣ جۆرە شێرپەنجەکەی کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی پێش دێن




**پیاوان:**

- شێرپەنجەی پرۆستات ٢٢%
- شێرپەنجەی سییەکان ١٦%
- شێرپەنجەی ڕێخۆڵە ١٣%
- شێرپەنجەکانی تر ٤٩%

**ئافرەتان:**

- شێرپەنجەی مەمک ٢٧%
- شێرپەنجەی ڕیخۆڵە ١٣%
- شێرپەنجەی سییەکان ٩%
- شێرپەنجەکانی تر ٥١%

**پڕۆستات چییە؟**

لە ناو جەستەی ئێمە دا چەندین جۆرگلاند یاخود لوو هەیە.گلاندەکان ئۆرگانێکن کە ماددەی ڕژێن پێکدێنن و دەری ئەدەن.ئەم شلەیە یاخوود ڕژێنە پێویستە بۆ کاروچالاکیەکانی ڕۆژانەمان.نموونەیەک لەم ڕژێنانە: گلاندنی فرمێسک،گلاندی لیک،گلاندی تایرۆئید و پانکریاس. پڕۆستاتیش گڵاندێکە.




هەر پیاوێک پرۆستاتی هەیە؛ درەنگ یان زوو ئەوە هەندێک کێشەی بۆ درووست دەکات.
پرۆستات گلاندێکە، کە لە نێرینەی پێگەیشتوودا نابێ گەورەتر بێت لە گوێزێک و 10-15 گرام کێشییەتی.
ئەم گلاندە پێکهاتووە لە سێ بەش، کە خۆی بە دەوری میزەڕۆ(Urethra ) و لە ژێر میزدۆ(میزەڵدان) جێگە داوە.
میزەڕۆ لە میزدۆ تا کۆتایی ئۆرگانی جنسی پیاو دەڕوات.
زیاتر لە ناوپیاوانی بەساڵاندا‌چوو، پرۆستات لە کێش و قەبارەی ئاسایی خۆی گەورەتر دەبێت، ئەوەش دەرئەنجامی گۆڕانکاری هۆرمۆنەکانە.
بەم هۆی باریکبوونەوەی میزەڕۆوە بەتاڵکردنی میزدۆ(میزڵدان) بە تەواوی ئەنجام نادرێت،چۆنکە دەروازەی میزدۆ و یان پرۆستات بەرگری دەکەن(پاڵ بە یەکترەوە دەنێن).
ئەوەش کاتێک هەست دەکرێت کە ئیتر میزکردن بە شێوەیەکی ئاسایی و بە سەختی ئەنجام بدرێت و هەندێک لەم کێشانەی خوارەوە تووشی پیاو دەبێت.

- **نیشانەکانی کێشەکانی پڕۆستات:**

- هێزی میزکردن کەمترە و هەندێکجار دەبڕێت/دەپچڕێت( پەستان لێکردن بۆ میز هێنان بێ سوودە)؛
- توانای بە باشی دە ستپێکردن بە میز کردن کەم دەبێتەوە؛

- زوو زوو هەستکردن بە هاتنی  و زوو زوو میز کردن؛
- چەندجار(زووزوو) میز کردن لە گەڵ هەستی کەمتر بۆ میز و ڕێژەی میز کەمتر بوونەوە؛
- چۆڕکە میزە/چرکە میزە(دوای میزکردن دلۆپەدلۆپە) کە لە ژێر کۆنترۆڵی مرۆڤ دا نەمێنێت؛
- شەوان میزبەخۆدا کردن
- لە کاتێ میزکردن هەست بە سووتانەوە کردن
- دوای میزکردن هەستی ئەوە هەبێ  کە میزدۆ خاڵی/ بەتاڵ نەبووە.

## - کار یان ڕۆڵی پرۆستات چییە؟

پرۆستات، گلاندێکی پیاوانەیە کە لیکێک ئەداتە دەرەوە کە لەگەڵ تۆو و ئاودا تێکەڵاو دەبێت.
پرۆستات ئەو لیکە بەرهەم دێنێت کە،لە کاتێ بەرهەڵدابوونی تۆو، لە گەڵ خانەکانی تۆو دێتە دەرەوە( Spermatozoid).
پرۆستات گرنگییەکی  بەرچاوی هەیە بۆ کاری زایەندەیی،نەک بۆ سێکس.
تەڕایی/ لیکی پرۆستات خانەکانی تۆو زیندوو ڕادەگرێت لە کاتێ خۆگواستنەوەیان بەراو خانەی هێلکەوە.
خانەکانی تۆولە ناو کیسەکانی تۆودان(گون) Testicle  بەرهەم دێت.
هۆرمۆنەکان کاریگەرن لە سەر: گەشەساندنی پرۆستات،بەرهەم هێنانی لیکی پرۆستات و  هەروەها بەرهەم هێنانی خانەکانی تۆو.

### نەخۆشییەکانی پرۆستات؟

ئەم نەخۆشییانەی  پرۆستات کە لە خوارەوە ئامازەیان پێ دەکرێت ئەبن بە هۆی کێشە و ئازار.
بۆ دۆزینەوەی جۆری نەخۆشی پرۆستات،ئەبێ پزیشک هەندێک لێکۆڵینەوە و پشکنین ئەنجام بدات و نەخۆشییەکە دەستنیشان بکات ،ئەوکاتە ئەودەتوانێت دەست بە چارەسەری نەخۆشییەکە بکات.

### Prostatitis هەوکردنی پرۆستات

هەوکردنی پرۆستات کە یەک نەخۆشییە لە نەخۆشییە جۆراوجۆرەکانی پرۆستات، کە لە هەر تەمەنێک دا لەوانەیە ڕووی بدات.
بە هۆی هەوکردنی شانەکانی پرۆستات، پرۆستات تووشی ئاوسان ئەبێت، کە دەرئەنجام میزەڕۆ بە هۆی پەستان تا ڕادەیەک باریک دەبێتەوە. ئینجا  میزکردن بە سەختی دێت و زۆر جاریش  بە ئازارە. هەروەها هەستی ئازارێکی سووتانەوە لە شوێنی گون و کۆم دا ڕووی ئەدات.
بەرهەڵبوونی تۆو یان فڕێدانی شەهوەت هەندێکجار لەوانەیە هۆکاری ئازاری هەندێک بەش لە جەستە بێت وەکو ناوڕان و بەشی ژێرەوەی جەستە. میزکردنیش لەوانەیە هەندێکجار بە سووتانەوە بێت.  بۆ زانینی هۆکارەکە و دەستنیشانکردنی جۆری ئەو باکترییایەی کە هەوکردنی درووست کردووە، لێرەدا  پێویستە پشکنین / چاندن (زەرع) لە سەر تۆو لە تاقیگەدا بکرێت.
ئینجا پزیشکی پسپۆر دەرمانی  Anti-biotica  دژە بەم جۆرە باکترییایەی کە بەگوێرەی ئەنجامی پشکنینەکە دۆزراوەتەوە دەنووسێت.
ئەم چارە بە دەرمانە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەکە کە ئەبێ بە تەواوی و ڕێکوپێکی بەکار بهێندرێت.

ئەنجام یان چاکبوونەوە دوای تەواوبوونی بەکارهێنانی دەرمانەکان دیار دەکات.
لەم وێنەیەی خوارەوەدا ئەبینین کە پرۆستات هەوی کردووە و سوور بۆتەوە.



**Prostatodynie ئازاری پرۆستات**

لە کێشەی ئازاری پرۆستاتدا دا ئازارەکە لە نێوان گون و کۆتایی ڕیخۆڵەی گەورە کە لە کۆم زۆر نزیکە هەست پێ دەکرێت،کە ئەم ئازارە خۆی دەگەیەنێتە نێو ڕانەکان و ئۆرگانی سێکسی.
ئەم ئازارە بە شێوەکانی جۆراوجۆر خۆی دەنوێنێت وەکو ئازاری سووتانەوە، موچڕکە،کوتان، ترشان یان ئازاری تییژ(پێوەدان).هەندیک جار کێشەی میز کردن ڕووی ئەدات.ئەم کێشانە بەردەوام نین، بەڵام خۆیان وەک بە بەرزی و نزمی پێشان ئەدەن(جارجارە).
ئازار بە تایبەتی لە کاتێ سەرما، گرژی(نالەباری دەروونی)، تووڕەیی،پەرێشانی، بەکارهێنانی خواردنەوەکانی ئەلکهولی، بەهارات و گژوگیای توند و تیژ و بۆ ماوەی دوور ودرێژ دانیشتن پەیدا دەبێت.
لە حاڵەتی ئازاری پرۆستات دا، پرۆستات بە هۆی باکتریا تووشی هەو نەبووە بەڵکوئەستوور بووە یان ئاوساوە.
پیاوانی تەمەن نێوان 35-50 زیاتر ئەم گرفتەیان تووش دەبێت تاکو لە گەنجان یان خوود پیاوانی بە ساڵاچوودا، بەڵام ئەم گرفتە ئەگەری هەیە لە هەموو تەمەنێکدا ڕووی بدات.
نەخۆشی ئازاری پرۆستات لە گۆشەی تەندرووستییەوە بە کێشەیەکی قووڵ بەراوورد ئەکرێت.ئەم کێشەیە قۆناغی ئامادەیی بۆ تووشبوونی شێرپەنجە نییە، وەکو هەندێک پیاو وای بیر لێ دەکەنەوە.
ئەم نەخۆشییە مەترسی ژیانی لە سەر نییە بەڵام زۆر ناخۆش و بە کێشەیە. هەندێکجار مرۆڤ ئەتوانێت بە باشی مامەڵە لە گەڵ گرفتەکەدا بکات دوای ڕاوێژ لە گەڵ پزیشکی پسپۆردا و لێکۆڵینەوە لەبارەی هۆکارەکان و هەنگاو بۆ چارەسەرییان.بۆ نموونە هۆکارێکی کە بە شێوەیەکی گشتی دابەزینی سیستەمی بەرگری جەستەی مرۆڤ و گرژی و ئاڵۆزی دەروونییە.
هەندێک جار حەمامێکی گەرم(بانیۆ) و پشوودان ئەم ئازارە کەمتر دەکاتەوە.
لەم وێنەیەی خوارەوەدا ئەبینین کام شوێنانە وە بەر هێرشی ئازار دەکەون.



Benign prostatic hypertrophy
**گەورە بوونی پرۆستات**

لەم وێنەیەی خوارێدا دیارە کە میزەڕۆ(Urethra ) بە ناو پرۆستاتدا دەڕوات.




پرۆستاتی نەگۆڕاو(ئاسایی) پرۆستاتی گۆڕاو

پرۆستاتی گەنجان بچووکە بەڵام بە تێپەڕبوونی تەمەن ئەو گەورەتر دەبێت. ئەم پرۆسەیە دوای تەمەنی ٥٠ساڵی ڕووی ئەدات.
تا چ ڕادەیەک پرۆستات گەورە دەبێت ئەوە لە کەسێکەوە تا کەسێکی تر جیاوازە.
لە زۆربەی پیاواندا قەبارەی پرۆستات زیاد ئەکات.
لە هەندێکیشیاندا کشان یان پەستان لە ناو پرۆستات دا زیاتر ئەبێت.بەڵام مەرج نییە بەم هۆیەوە هەر پیاوێک ئازاری هەبێت.
هۆکاری تووشبوون بەم نەخۆشییە بریتییە لە بەرزبوونەوەی تەمەن و گۆڕانکاری لە هۆرمۆنەکانی جەستەی مرۆڤدا.جاریوایە ئەم گۆڕانکارییە زیانی زۆری پێوە نییە.بەڵام جاریوایە کێشەی مەترسیداری پێوەیە وەکو نەخۆشی شێرپەنجەی پرۆستات.

پرۆستات بە دوو شێوە قەبارەی گەورەتر ئەبێت، لە دەرەوە یان لە ناوەوە،ئینجا خۆی بە توندی بە دەوری میزەڕۆدا دەبەستیت و ئەم ئەندامە تەسک دەکاتەوە.
ئینجا کە میز ەڕۆ باریک بۆیەوە،گرفتی میزکردن درووست ئەبێت،چۆنکە ماسوولکەی میزدۆ پێویستە زیاتر کار بکات و پەستانی لە سەر پەیدا ئەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت میز بە ناو ئەم ڕێگە تەسکەدا فڕێداتە دەرەوە.
دەرئەنجامی ئەم زیادە پەستانە دیواری میزدۆ لاوازتر ئەبێت و دەش بێت کە لە یەکتر ڕابکشەرێت.
دوای تێپەڕبوونی کات میزدۆ ناتوانێت خۆی کۆ یان گرژ بکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت میز بە تەواوی فڕێداتە دەرەوە، ئینجا ڕێژەیەک میز لە میزدۆدا دەمێنێتەوە.
ئەگەر چارەسەری ئەم کێشەیە نەکرێت،ئەوە کێشەی هەوکردنی میزدۆ و گورچیلەکان ڕووی ئەدات.
وێنەی خوارەوە نیشان ئەدات پرۆستاتی ساغ (خەتەکانی سوور) و پرۆستاتی گەورە بووچی جیاوازییەکی هەیە.
(لەم وێنەی خوارەوەدا ئەیبینن کە پرۆستات لە قەبارەی ئاسایی خۆی گەورەتر بووە)



**شێرپەنجە چییە (بە کورتی)؟**

جەستەی مرۆڤ پێکهاتووە لە چەندین ملیارد خانە. خانەکان دابەش دەبن،ئەوان کۆپی لە خۆیان درووست دەکەن.
بەم شێوەیە مرۆڤ (منداڵ) گەورە دەبێت.هەروەها لە مرۆڤی پێگەیشتوو(گەنج) ، گەورە ش دا خانەکانی دابەش دەبن.
ئەم میکانیزمە پێویستە،چۆنکە خانەکان تەمەنییان کوورتە و ڕۆژانە لە ناو دەچن.هەموو نەرمکەیەک/ بەستەرە شانەیەک خۆی نوێ دەکاتەوە. بەم شێوەیە برینەکان چاک ئەبنەوە و دەرئەنجامی ئەوەیە کە ئێمەی مرۆڤ تەندرووستیمان پایەدار دەبێت.
بەڵام جاریوایە ئەم دابەشبوونەی ئاسایی تێک دەچێت.لێرەدا گرێ پەیدا دەبێت.ئەم گرێیانەی کە ناتوانن خۆیان بگوازنەوە بۆ شانەکانی تر پێیان ئەڵێین گرێی پاک وبێزیان (Benign ).ئەمانە

هەندێکجار لە سەر ڕێگان و پەستان لە سەر ئۆرگانێک دەکەن و ئەبن بە هۆکاری ئازار.ئینجا بە ڕێگەی نەشتەرگەری دەکرێت لابردرێن.
بۆ نموونە بالووکە Wart کە گرییەکی بێزیانە، کە دروست ئەبێت.
ئەو گرێیانەی کە ئەتوانن خۆیان بگوازنەوە بۆ ناو شانەکانی تر"هێرش بکەنە سەر شانەکانی تر" پێی ئەڵێن گرێی سندانداریان مەترسیدار Malign or Cancer (شێرپەنجە).
ئەم شێرپەنجەیە ئەتوانیت پەل بهاوێت لە جەستەدا( Metastasis ) واتە بڵاو ببێتەوە.
بە گوێرەی ئەم شوێنەی کە لە سەرەتادا شێرپەنجەی لێ دروست بووە ، ناوی بۆ دەستنیشان دەکرێت.

شێرپەنجەی پرۆستات ئەتوانێ خۆی بە ڕێگەی لیکی ناو لووەکانی جەستە یان خوێن بۆ نموونە ناو گلاندەکانی لیمفاوی ( lymph node )،ئێسکەکان( Bones ) و سییەکان( Lung ) بگوازێتەوە.

**شێرپەنجەی پرۆستات**

لە حاڵەتێکدا کە شێرپەنجەی پرۆستات لە ئارا دەبێت، گلاندێکی زیانمەند لە دەوری پرۆستات دروست ئەبێت، ئەم نەخۆشییەی پرۆستات پێی ئەڵێن Prostate Cancer / Prostate Carcinoma واتە شێرپەنجەی پرۆستات کە وورده وورده گەورە ئەبێت. ئەم جۆرە شێرپەنجەیە لە گەنجاندا زۆر بە کەمی پێش دێت.دوایی پشکنین، پزیشک دەتوانێت بە هۆی ڕەقبوونی پرۆستات زانیاری وەرگرێت کە نیشانەی شێرپەنجەی پێوەیە.

لەم وێنەیەدا ئەبینین کە پرۆستاتی تووشبوو بە شێرپەنچە چۆن خۆی دەرخستووە.



**نیشانەکان:**

گرێی شێرپەنجەی پرۆستات بە شێوەیەکی گشتی بە ماوەیەکی دوور و درێژ خۆی دەرئەخات ونیشانەیەکی بەرچاوی نییە تاکو تەشەننا دەکات و لە شوێنی تر لە جەستەدا پەل دەهاوێت و

لەم شوێنەدا کێشە یاخود ئازار دروست ئەکات.وەکو ئازاری پشت کە لەوانەیە لە بڕبڕەی پشتدا پەلی هاویشتبێت.
کێشەکانی کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکراوە وەکو میزکردن بە ئازار و بە دڵۆپە یان چۆڕچۆڕە ئەگەری نیشانەی شێرپەنجەی پڕۆستاتە.
کێشە وئازار و سووتانەوە کاتێ میزکردن و میزی خوێناوی و تەڵخ هەموو کاتێک نیشانەی شێرپەنجە نین و پەیوەندی بە کێشەیەکی ترەوە هەیە. لێرەدا پێویستە بزانین کە بە تەنیا شێرپەنجەی پڕۆستات ئەو نیشانانە وەکو تەسک بوونەوە و گرفتەکانی تری میزۆڕۆ دروست ناکات بەڵکو ئەم نیشانانە هەروەها لە نەخۆشییەکانی تری پڕۆستات دا دەبیندرێن.

**هۆکارەکان:**
هۆکاری بنەڕە تی نەخۆشی شێرپەنجەی پڕۆستات جارێ دیارنییە.بەڵام هەندێک ئەگەر و ریسک فاکتەر هەن.
ئەم نەخۆشییە زیاتر لە نێوان پیاوانی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوایی و وڵایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پێش دێت. ئەمەش لەوانەیە بە هۆی زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی چەوری و پڕۆتین بێت.
ئەوەی کە دیارە،ڕێژەی تووشبوون بە شێرپەنجەی پڕۆستات زیاترلە پیاوانی بەساڵداچوو هەیە وبە شێوەیەکی گشتی لە نێوان پیاوانی تەمەن نێوان ٤٠ تا ٤٥یش دەستنیشان دەکرێت.
لە پەنا ئەوەشدا گۆڕانکاری لە هۆرمۆنەکانی پیاوانەدا هۆکارێکی ترە بۆ تووشبوون بەم جۆرە شێرپەنجەیە.
فاکتەرەکانی ژینگە ش کاریگەری نەرینیان هەیە لە پەیدابوونی شێرپەنجەی پڕۆستات.
لە کۆتاییدا بە ڕێژەی ٥ تا ١٠% ی شێرپەنجەکانی پڕۆستات هۆکاری بۆ ماوەیی (ویراسی) هەیە.

**پشکنین و ڕێگەکانی دەستننیشانکردنی نەخۆشی شێرپەنجەی پڕۆستات:**
The Urologist کە پزیشکی پسپۆرە لە نەخۆشییەکانی تایبەت بە بەشی ئۆرگانی زایەندەیی و ڕیگەکانی میزەڕۆ چ لە ئافرەتاندا و چ لە پیاواندا.
ئەم پسپۆرە هەندێک پرسیار لەبارەی کێشە و گرفتەکان ئاراستەی نەخۆش دەکات کە پەیوەستن بە تەندرووستی گشتی لە ئێستادا و لە ڕابردوودا.
بە درووست و بە ووردی وڵامدانەوە بە پرسیارەکان،یارمەتی پزیشک دەدرێت بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی.
هەروەها پشکنینێکی گشتی جەستە دەکرێت. زۆر جار هەندێک پشکنین و لێکۆڵینەوەی تایبەت ئەنجام ئەدرێن بۆ باشتر دۆزینەوەی نەخۆشی.پزیشک خۆی ئەزانێ کام پشکنین و توێژینەوانە پێویستن.

## پرسیار لە بارەی میزکردن
لەم کاتەدا بۆ ئەم مەبەستە پسپۆرەکان خشتەیەکی تایبەتییان دارشتووە بە پرسیاری تایبەت بە کێشەکانی میزکردن لەم نەخۆشییەوە، کە ئەم خشتەیە داڕێژراوە "نێودەوڵەتییە". لیستی ئەم پرسیارانە ، کە هەندێک پرسیار باری جۆری میزکردن دەگرێتەوە ئەبێ خۆت لیستەکە بە وڵامدانەوە پڕ بکەیتەوە. بەم شێوەیە پزیشک و بە گوێرەی وڵامەکان ئەتوانێت سەر لە

نەخۆشییەکە دەر بێنێت و زۆر جاریش هەر پزیشک خۆی پرسیارەکان ڕاستەوخۆ ئاراستە دەکات.بۆ نموونە لە کوردستان لەوانەیە پزیشک پرسیار بکات ئەگەر میز ئەکەی جێگای میزەکەت تا چ ڕادەیەک خاک قووڵ دەکات؟.
لە پەنای ئەوەشدا پزیشک لیستی تایبەت بە پرسیاری تایبەتەوە ئاراستە دەکات،کە ئەوە دوای ئەنجامی کردەوەی پشکنین و چارەسەرییەکە،بۆ ئەوەی بزانێت ئەنجامەکەی چی لێهاتووە.

## پشکنینەکان: / ڕێگەکانی دەسنیشانکردنی شێرپەنجەی پڕۆستات

Rectaal toucher / پشکنین بە ڕێگای کۆم دا

لە پشکنینی گشتی جەستەییدا هەمیشە پشکنین بە ڕێگەی کۆم دا ئەنجام ئەدرێت کە پزیشک بە پەنجە یی بە دەستەوانە و چەور کراو ،لە ڕێگەی کۆمەوە بەراوردی پڕۆستات دەکات بۆ ئەوەی بزانیت قەبارەی گەورەیی، شێوە، ڕەقی یان پتەویی وشوێنی(بەرزی و نزمی) پڕۆستات بزانێت.
ئەم پشکنینە ئاساییە و لە چەند چرکە زیاتری پێ ناچێت.
شێوازی ئەم پشکنینە بە چەند جۆر دەکرێت(داهاتنەوە،پاڵکەوتن/ڕاکشان لە سەر تەنیشت) و لە کاتێ ئەم پشکنینەدا هەست بە ئازار ناکرێت بەڵام کردەوەیەکی ناخۆشە وەکو لە لایەن زۆر لە پیاواندا بەیان کراوە چۆنکە پەنجە بە ماسوولکەی کۆمدا ڕەت دەبێت کە ئەم ماسوولکەیە خۆی بە توندی گرژو کۆ دەکاتەوە.

Toucher Rectal پشکنین بە ڕێگەی کۆم



**Blood & Urinalysis**

پشکنینی خوێن - میز

خوێن وەردەگیرێت بۆ پشکنینی باری تەندرووستی بە شێوەیەک گشتی و بە تایبەتی بۆ دیاری کردنی کارکردنی گورچیلەکان.
هەروەها پشکنینی خوێن بۆ مەبەستی دۆزینەوەی ئەم مادانەی کە نیشانەی تایبەت ئەدەن دەست بۆ هەبوونی کێشەی نەخۆشییەکانی پڕۆستات(PSA= Prostate Specific Antigen)
ئەم مادەیە ڕێژەکەی بەرز دەبێتەوە لە ناو خوێن ئەگەر پڕۆستات؛ تووشی هەوکردن بووبێت، قەبارەی گەورەتر یان ئەگەر پڕۆستات تووشی شێرپەنجە بووبێت.

پێوەرەکانی PSA (پی ئیس ئەی) پەیوەستن بە تەمەن(سەیری ئەم خانەیە بکە).
بە گوێرەی چوونە سەرەوی تەمەن و گەورە بوونی پرۆستات،ئەم مادەیەش ڕێژەی لە ناو خوێندا دەچێتە سەرەوە.
هەروەها میز پشکنینی لە سەر دەکرێت. هەندێک جاریش پشکنین لە سەر تۆو دەکرێت.

Normaal PSA (ڕێژەی ئاسایی پی ئێس ئەی لە خوێندا):

| | |
|---|---|
| 49-40 ساڵ | PSA< 2,5 ng/ml |
| 59-50 ساڵ | PSA<3,5 ng/ml |
| 69-60 ساڵ | PSA<4,5 ng/ml |
| 79-70 ساڵ | PSA<6,5 ng/ml |
| 89-80 ساڵ | PSA<8,5 ng/ml |

**پشکنین بە شێوەی Uroflowmetry**

لەم تاقیکردنەوەدا بە ئامێری (Uroflowmetry) مرۆڤ سەیری ئەوە دەکات تا بزانێت تا چی ڕادەیەک میز بە هێز دێتە خوارێ و هەروەها ڕێژەکەی دەپێوێت. پێش ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوە،پزیشک داوات لێدەکات کە میزدۆیەکەت ئەبێ پڕ لە میز بێت.




Urodynamic-test

ئەم تاقیکردنەوەیە پشکنینە بۆ پێوانی پەستان(هێز) و کارکردنی میزدۆ و میزەڕۆیە. لە هەندێک حاڵەتدا کێشەکانی میز ناگەڕێتەوە بۆ سەر پرۆستات کە گەورە بووە و لە سەر ڕێگەدایە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ تێکچوونی میزدۆ و گەردەنەیی میزدۆ(دەروازەی میزڵدان).
ئەم توێژینەوە بە ڕێگەی سۆندەیەکی زۆر باریک کە قەبارەکەی(2-3 mm) ئەستوورە ئەنجام ئەدرێت، کە ئەم سۆندەیە بە ڕێگەی بۆڕی میزەوە دەبرێتە ناو میزدۆ. بە ڕێگەی ئەم سۆندە باریکە پزیشک ئەتوانێت میزدۆ پڕ بکات و دیسان خاڵی/ بەتاڵی بکاتەوە.لەم تاقیکردنەوەشدا پزیشک ئەتوانێت هێزی فڕێدانی میز بپێوێت.
لە ڕێگەی ئەم توێژینەوانە هۆکاری ڕێبەستەکانی میز کە بە هۆی پرۆستات و یان کاری نائاسیی میزدۆ درووست بوون دەرئەکەون.

توێژینەوەکە بە ئازار نییە. بەڵام ئەم ماددە ڕەنگییە/ شلەی کە کراوەتە ناو میزدۆ، بۆ ماوەیەکی کوورت تامێکی تاڵ و گەرم ئەدات.ڕۆژێک  پێش توێژینەوە دەرمانێک ئەبێ بەکار بهێندرێت بۆ ئەوەی ناو ڕیخۆڵەکان پاک بکاتەوە
و هەروەها شەوی پێشتر نابێ خۆراک بخورێت.ئەگەر ناو ڕیخۆڵەکان پاک بن،ئەوە ڕێگەڕۆی میز باشتر دیار دەکات.

**Ultrasonography (Echo) / پشکنین بە ڕێگەی سۆنۆگرافی**

لێرەدا بە ڕیگەی مەوجەکانی دەنگە،کە ئۆرگانێک دێنێتە بەرچاو(سەر شاشە).
ئەم پشکنینە هەم لە دەروەی جەستە لە ڕێگەی پێستی زگەوە و هەروەها لە ناوەوە لە ڕێگەی کۆمەوە دەکرێت.
لە ڕیگەی زگەوە  ئەتواندرێت گورچیلەکان و میزدۆ نیشان بدرێن.
هەروەها پزیشک دەتوانێت ببینێت کە دوای میزکردن چ ڕێژەیەک میز لە ناو میزدۆ دا دەمێنێتەوە.
لە ڕێگەی چاولێکردنی ناوەوە  ئەتواندرێت بە ڕێگەی کۆم وکۆتایی ڕیخۆڵە گەورەیی،چۆنییەتی شێوەی پرۆستات ببیندرێت.ئەم پشکنینە لە ڕێگەی ئامێرێکی باریک،کە بە بێ ئازار لە کۆمەوە دەبرێتە ناوەوە و ئەنجام ئەدرێت.

**Cystoscopy**

ئەم پشکنینە واتە سیستۆسکۆپی بە ڕێگەی ئامیرێکەوە کە دەبرێتە ناو میزەڕۆ و سەیر دەکرێت بۆ زانینی چۆنییەتی ڕێگەی میزەڕۆ،گەورەیی بەشەکانی پرۆستات (پێکهاتووە لە سێ بەش) و چۆنییەتی یان پێکهاتەی پەردەی ناو میزدۆ هەڵدەسەنگێندرێت.
بۆڕییەکی باریک کە دەچەمێتەوە،ئامێری چاولێکردن Cystoscope کە بە ڕێگای میزەڕوە دەنێردرێتە ژوورەوە.ئەڵبەتە پێشتر ماددەیەکی لینج بۆ لووسکردنی ئەم بۆڕییە بەکار هاتووە و هەروەها بۆ ئەوەی کە پەردەی ناو میزدۆ(میزڵدان) سڕ بکرێت.
ئەم ئامێرە بریتیە لە کامیرە و ڕوناکی کە بەم شیوەیە پزیشک لە ڕێگەی میزەڕۆوە،ئەتوانێت ناو پرۆستات و میزدۆ سەیر بکات.
بە م ڕێگەیەوە میزدۆ پڕ دەکرێت لە هەندێک ئاوی ستریل(پاککراو) بۆ ئەوەی پزیشک بتوانێت باشتر ناو میزدۆ ببینێت.
دوای ئەم پشکنینە لەوانەیە هەست بە وە بکەی کە زوو زوو میزت دیت بەڵام ئەم هەستە دوای چەند کاتژمێرێک لە خۆیەوە نامێنێت.




Biopsy

هەندێکجار پێویست دەکات کە پشکنین لە سەر شانەی پڕۆستات بکرێت ئەوەش بە وەرگرتنی چەند پارچەیەک لە شانەی پڕۆستاتە.

پارچە وەرگرتن بە ڕێگەی دەرزییەکی باریکەوە دەکرێت کە بە ڕێگەی کۆتایی ڕیخۆڵەوە دەبرێتە ناو پڕۆستات.

پزیشک بۆ بەرگری لە "هەوکردن" /چڵکی بوون دەرمانی دژ بە باکتریا ( antibiotica ) دەنووسێت.ئەم دەرمانە پێویستە پێش توێژینەوەکە بەکار بهێندرێت.

پارچە لێکراوەکان Biopsy دەخرێتە ژێر میکرۆسکۆپ تا لێی وورد ببنەوە.ئەمە بۆ مەبەستی زانین لە سەر ئەگەری شێرپەنجەیە.ئەنجامەکەی چەندین ڕۆژ دەخایەنێت(10-15 ڕۆژ).

دوای ئەم توێژینەوەیە مرۆڤ لەوانەیە خوێنی بەر بێت لە کاتێ میزکردندا،کاتێ پیسایییکردن و یان کاتێ فڕیدانی تۆو. هەندێک جاریش لەوانەیە پلەی گەرمای جەستە بەرز بێتەوە تا 38.5 گراد.

ئەگەر پلەی گەرمای جەستە بەرز بوو، ئەوە پێویستە مرۆڤ سەردانی پزیشک بکات.

پارچەوەرگرتن ئەگەری بڵاوبوونەوەی شێرپەنجەی پڕۆستاتی پێوە نییە،ئینجا ئەبێ بزانین کە لەم بارەوە بێ زیانە.

Gradation/ پایەبەندی

ئەگەر دوای لێکۆڵینەوەی میکرۆسکۆپی شێرپەنجەی پڕۆستات دەستنیشان کرا،ئینجا پایەبەندی (دەرەجە) دەکرێت و هەروەها پلەی "مەترسی/زیانمەندی" خانەکانی شێرپەنجەی پڕۆستات دەستنیشان دەکەن.

ئینجا مرۆڤ باس لە Differentiates-grade دەکات.
ئەگەر پایەی باش بێت،ئەوە شێرپەنجەی پرۆستات درەنگتر گەورە دەبێت(پەرەپێساندن یان تەشەناکردن) تاکو پایەی تر کە مەترسیدارە و زووتر گەورە دەبێت. جۆرە پایەبەندییەکی تر پایەبەندی (Gleason-score(2-10 .

**ئەم پشکنینانەی کە لە خواەودا ناو دەبرێن کاتێک ئەنجام ئەدرێن کە:**

1) گوومان لە هەبوونی شێرپنجە بکرێت
2) ئەگەری بڵاو بوونەوەیی شێرپەنچە هەبێت و یان بە دواییدا بگەڕێن

### Bones-Scan

ئەم پشکنینە وێنەی تەواوی ئێسکەکانی مرۆڤ واتە پەیکەرە کۆئەندام( Human skeleton ) کە 206 پارچەیە دەگیرێ و دەخرێتە بەردیدی پزیشکی پسپۆر لەم بارەوە.
هەروەها ئەم پشکنینە Isotop-Scan شی پێی ئەڵێن.لەم جۆرە پشکنینەدا ڕێژەیەکی زۆر کەم لە ماددەی
Radio-active بە ڕێگەی خوێنهێنەر لە جەستە دەدرێت،ئینجا ئەم ماددەیە خۆی دەگەیەنێتە سەر ئەو شوێنانەی کە شێرپەنچەی تێیدا پەلی هاوێشتووە(بڵاو بۆتەوە) دەنیشێت. بەم شێوەیە بڵاوبووەکان دیار دەکەون.
لەم پشکنینە دا، دوای لێدانی ماددەکە لە جەستە ماوەی چەند کاتژمێرێک دەخایەنێت تاکو دەگاتە سەر تەواوی ئێسکەکان،ئینجا دوایی دەست بە وێنەگرتن دەکریت.
ڕێژەی ئەم ماددە رادیۆ ئەکتیڤە زۆر کەمە و زیانمەندی بۆ جەستەی مرۆڤ و بۆ دەوروبەریش نییە.

### CT-Scan

Computer-Tomography کاتێک پێویستە کە زۆر بە ووردی لە وێنەکانی پرۆستات بکۆڵنەوە .هەروەها
زانیارییەکیش لە بارەی ئۆرگانەکانی تر و ڕژێنەکانی لیمفاوییەکان ئەدات.
لەم تەکنیکەدا تیشکی X و کۆمپیوتەر بەکار دێت.
زیاتر، پێشەکی ماددەیەکی ڕەنگی تایبەت لە خوێنهێنەرڕا دەنێردرێتە ناو جەستە؛ جاری وایە پێش گرتنی وێنەکان ئەبێ ماددەیەکی شل کە شێوەی دۆشاوی خۆرما / ترێیە بخورێتەوە.

### MRI-Scan

Magnetic Resonance Imaging جاریوایە پێویستە بۆ گەیشتن بە زانیاری زۆر وورد و شاراوە کە بە پشکنینە کانی تر نادۆزرێتەوە.
ئەم پشکنینە بە هێزی ڕاکێشان(میگناتیسی) کار دەکات کە هەروەها پێی ئەڵێن Radio frequency energy .

**چارەسەرییەکان:**

لە حاڵەتی شێرپەنجەدا واتە Carcinoma بۆ چارەسەری پرۆستات چەند تەکنیک هەیە ئەویش بە ڕێگەی نەشتەرگەری، بە تیشک ( Radiation )، چەرەسری کیمیایی وبە ڕێگەی هۆرمۆن.
ئەگەر شێرپەنچەکە لە قۆناغێکی پێشچوو (قووڵ) دابێت و لە شوێنەکانی تری(ئۆرگانەکاندا) پەلی هاویشتبێت، ئەوە گەورەبوونی پرۆستات بە ڕێگەی دەرمانی هۆرمۆنەکان ڕادەگیردرێت،ئینجا کێشە وئازار کەمتر دەبێتەوە بۆ ئەوەی کە ژیان بە ئاسایی و بێ ئازار بێت.

- **چاوەڕوانی**

ئەگەر شێرپەنجەی پرۆستات بە ڕێکەوت دوایی نەشتەرگەری پرۆستات دەرکەوت لە ژێرلێکۆڵینەوەی میکرۆسکۆپدا و نەخۆش پێشتر گرفتی نەبووبێت، ئەوە ئەکرێت جارێ چاوەڕوان بێت. بەڵام ئەبێ هەر شەش مانگ جارێک کۆنترۆڵ بکرێت(لە ژێر چاودێری بێت) لە لای پزیشکی پسپۆر. پزیشک بە ڕێگەی پشکنینی خوێن و پشکنین لە ڕێگەی کۆمەوە و بە سۆنەر(سۆنۆگرافی) لە ڕێگەی کۆتایی ڕیخۆلە ( TRUS ) و هەوەها سکەن کردنی ئێسکەکان(ئیسکەلەت) نەخۆشییەکە لە ژێر چاودێریدا ڕادەگرێت.

- **نەشتەرگەری**

ئەگەر گرێی شێرپەنجەییەکە بە تەواوی لە ناو پرۆستات دا بێت، ئەوسا ئەبێت نەشتەرگەرییەکە ریشەیی واتە
(Radical )بێت.
لەم نەشتەرگەرییەدا پرۆستات لە بنەڕەتەوە و کیسەکانی تۆو هەڵدەگیرێن و هەروەها ئەگەر بگوونجێت، دەمارەکانی هەست (عصب) ڕادەگرن ئەوە بۆ مانەوەی حاڵەتی Erection (ڕەپ بوونی ئۆرگانی زاییندەیی نێرینە).
پێش یان لە کاتی نەشتەرگەریدا جاریوایە Lymph nodes/ گلاندەکانی لیمفاوی سەر حەوز/سێبەندە هەڵدەگرن و دەینێرن بۆتاقیگە ی میکرۆسکۆپی بۆدۆزینەوەی " ئەگەری" بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە.

**ئەگەر شێرپەنجەکە پەلی نەهاویشتبێت،ئەوە پرۆستات لە ڕێشەوە هەمووی هەڵدەگرن واتە**
Radical Prostatectomy




*دوایی نەشتەرگەری هەڵگرتنی پڕۆستات بە تەواویی(ڕیشەیی)    پێش نەشتەرگەری هەڵگرتنی*

ئەگەر لە ئەنجامی پشکنینی  میکرۆسکۆپیدا دیار کەوت کە شێرپەنجەکە پەلی هاویشتووە(بڵاو بۆتەوە)، ئەوە نەشتەرگەری ڕەت ئەگرێتەوە،چۆنکە بێ سوودە. ئینجا پزیشک هەندێک ڕێگە چارەسەری تر پێشنیار دەکات.

**- پێش نەشتەرگەری**

بۆ نەشتەرگەری  Radical Prostatectomy بێهۆشی تەواوی پێویستە (خەواندنی تەواو).ڕۆژێک پێشتر لە نەخۆشخانە نەخۆش وەردەگرێت. پزیشکی نەشتەرگەر شیوەی نەشتەرگەرییەکە و پزیشکی بێهۆشی جۆری خەواندنەکە و لە بارەی دەرمانی ئازارشکێن باس دەکات.
پێست و شوێنی نەشتەرگەری دەتراشرێت و هەروەها دەرمانی پاککردنەوەی گەدە/ڕیخۆڵەکان ئەبێ بەکار بێت، بۆ ئەوەی کە ناو زگ پاک بێت،چۆنکە دوایی نەشتەرگەری نابێ پەستان لە زگ بکرێت ئەگینا پەستان ئەکەوێتە سەر برینەکە.ئینجا ئێوارەی پێش ڕۆژی نەشتەرگەری نەخۆش نابێ هیچ بخوات و بخواتەوە.هەندێکجار ئە کرێت نەخۆش پێش بردنی بۆ ژووری نەشتەرگەری دەرمانی "هێدی" کەرەوەیی بدرێتێ ئەگەر باری دەروونی گرژ بێت و یان شڵەژانی دەروونی هەبێت.
نەشتەرگەرییەکە چەند کاتژمێرێک دەخایەنێت. ئێستا لەم کاتەدا  هەروەها  بە تەکنیکی Laparoscopy ئەکرێت پڕۆستات هەڵبگرن. بەڵام ئەم تەکنیکە بۆ هەموو کەسێک گوونجاو نییە.

**دوایی نەشتەرگەری**

دوایی نەشتەرگەری نەخۆش ماوەیەک تا بەهۆش هاتنەوەی لە ژووری  Recovery دا دەمێنێتەوە. بۆ ماوەی  یەک تا دوو حەفتە  لە نەخۆشخانە دەمێنێتەوە و تا دوایی 10 ڕۆژ سۆندەیەک Catheter  لە ناو میزدۆ دادەنێن بۆ هێنانی میز لە میزدۆیەوە بۆ دەرەوە کە ئەم سۆندە باریکە لە ڕێگای میزەڕۆوە دەخرێتە ناو میزدۆ(میزەڵدان).

به دانانی ئەم سۆندەیە،پشوودانە بە برینی نەشتەرگەرییەکە و هەروەها تا پارچە خوێنی بەستەڵەک بهێنێتە دەرەوە.
ئەم سۆندەیە لەوانەیە هەندیک ئازار تووشی نەخۆش بکات،بەڵام بە بەکارهێنانی ئازارشکێن ئەوە چارەسەر دەکرێت.
کاتێک ئەم سۆندەیە دەردێنن کە وێنەی میزدۆ بە تیشکی Rontgen-X گیرابێت، بۆ ئەوەی "ئەگەری" هەبوونی دڵۆپەکردن لە نێوان ڕێگەی نوێیی(دروستکراوی) میزدۆ و میزەڕۆ.

- **ماوەی چاکبوونەوە**

لە ماوەی چاکبوونەوەدا،باشتر وایە نەخۆش ئاو زۆر بخواتەوە.
لەوانەیە ئازار و کێشەی میزکردن و هەبوونی خوێنی بەستەڵەک لە ناو میزدا هەبێت، بەڵام ئەوانە کاتیین و پێویست بە نیگەرانی ناکات.
لەوانەیە کێشەی میزلەخۆڕاگرتندا ڕووی بدات. بە ڕاوێژێک لە گە ڵ Physiotherapy (عیلاج طبیعی)کە ئەو نەخۆش فێر دەکات بۆ ڕاهێنانی حەوز،کە ئەم گرفتە کەمتر بێتەوە و یان لابچێت.

- **شێرپەنجەی پڕۆستات و سێکس:**

خوێنهێنەر و ئەو دەمار/ زنجیرە عەصەبەکانی کە کار دەکەن بۆ کردەوەی Erection (ڕەپبوون ) بە نزیک پڕۆستات دا دەڕۆن.ئەوەش هەمیشە ناتواندرێت لە کاتی نەشتەرگەری یان چارەسەرییدا بپارێزرێن. ئەڵبەتە ئەوەش پەیوەستە بە ئەو قۆناغەی کە شێرپەنجەی پڕۆستاتی تێدایە.
لەوانەیە ماوەی نیوساڵ بخایەنێت تاکو مرۆڤ بزانێت کە ئایا ئەوانە پارێزراون یان ئەگەری تێکچوونی کردەوەیی(ڕەپ بوون) بزانرێت.

- چارەسەری بە ڕێگەی تیشک / ڕادیۆتراپی
**Radiation/Radiotherapy**

بە تیشک خانەکانی شێرپەنجە لەناو دەبرێن. شانەی ساغییش تووشی زیان دەبێت،بەڵام ئەو لە زۆربەی حاڵەتدا دیسان نۆژەن دەبێتەوە .
ئەوە بە دوو شێوە ئەنجام ئەدرێت: لە دەرەوەڕا و لە ناوەوە ڕا. لە هەندێک حاڵەتیشدا هەروەها Hormontherapy واتە چارەسەری بە ڕێگەی هۆرمۆن لە گەڵیدا دەکرێت.

- **تیشک لێدان لە دەرەوەڕا**

تیشک لێدان لە دەرەوەڕا ( Megavolt Radiation ) کە ئەم جۆرە تێشکە ماددەی ڕادیۆئەکتیڤە و ڕێک لە سەر خانەکانی شێرپەنجە دەدرێت،بۆ ئەوەی کە خانەکانی ساغ کەمتر زیانمەند بن و بپارێزرێن.
نەخۆش 30- 35 لە ماوەی چەند حەفتەدا و لەژێر ئامێری تایبەتی تیشکدا ئەم جۆرە چارەسەرییە وەردەگرێت، هەرجارێک چەند خولەکێک دەخایەنێت. کاتێ ئەم چارەسەرییە ئەگەری زۆرە چەند دواکێشە بۆ نەخۆش بێتە ئاراوە وەکو
ماندوویی،بێهێزی،ئێڵنجهاتن/دڵتێکهەڵاتن،بەربوونی خوێن لە گەڵ میزدا و زگچوون.
کێشەی Erection effect تێکچوونی هەستی حەز و توانایی سێکس کردن لەوانەیە هەتا ساڵانێک دوایی ئەم چارەسەرییەش هەر بمێنێتەوە.

- **تیشک لێدان لە ناوەڕا**

تیشک لێدان لە ناوەڕا کە هەروەها Brachy therapy پێی دەڵێن، بە ڕێگەی دەرزی، تۆخمی زۆر بچووکی مادەی ڕادیۆئەکتیڤ دەخەنە ناو پرۆستاتەوە.ئەم کردەوەییە بە ڕێگەی پێست لە نێوان کۆم و کیسە ی گوونەوە دەکرێت.
ئەم نەشتەرگەرییە بە سڕکردن لە ڕێگەی پشتەوە ئەنجام ئەدرێت.بۆ ئەم نەشتەرگەرییە نەخۆش پێشتر وەردەگرن و لە نەخۆشخانە ئەی خەوێنن.
تیشک لێدانەکە تەنیا لە سەر گرێیەکەیە و تا شانە شێرپەنجە مەترسیدارەکە لە ناو دەچێت.
دوایی نیوساڵ تیشکەکە کاریگەرییەکەی تەواو بووە.تۆوەکانی ڕادیۆئەکتیڤ لە ناو پرۆستات دا دەمێننەوە. کاتێ لێدانی تیشک هەست بە هیچ ناکرێت.
لە دواییدا تا چەند مانگێک لەوانەیە هەندێک کێشەی میزکردن بێتە ئاراوە،ئەم کێشانە بە دەرمان چارەسەر دەکرێن.




*لێدانی تۆوەکانی ڕادیۆئەکتیف*

- **کاریگەریکردن لە سەر شێرپەنجەی پرۆستات کە لە قۆناغێکی زۆر قووڵدابێت بە ڕێگەی هۆرمۆنەکان:**

چۆنکە شێرپەنجەی پرۆستات لە سەرەتادا کێشە یان ئازارێکی پێوە دیار نییە و ئینجا شێرپەنجەکە تەنیا لە پرۆستات خۆی دانییە بەڵکو بڵاوبوونەوەشی بە دووادایە.لەم نەخۆشییەدا زیاتری بڵاوبووەکان لە ناو گلاندەکانی لیمفاویی و یان ئێسکەکان دایە.
شێرپەنجەی پرۆستات لە ژێر کاریگەریی هۆرمۆنی پیاوانە دا Testosterone زیاد دەکات.
بە ڕاگرتنی ئەم هۆرمۆنە 80% لە نەخۆشان خانەکانی شێرپەنجەییان ڕادەوەستێت و هەروەها ئازار سووکتر دەکات.
ڕاگرتنی ئەم هۆرمۆنە بە چەند شێوە ئەکرێت.

**ئەم چارەسەرییە برێتییە لە:**

- بە ڕێگەی نەشتەرگەری گوونەکان، کە هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن درووست دەکەن،
- دەرمان کە بەرگری لە درووست بوونی ئەم هۆرمۆنە دەکەن ( LH-RH-analogs )،
- دەرمانانەی کە پەیوەندی/ بەستنەوەیی تێستۆستێرۆن لە گەڵ خانەکانی پرۆستات بەرگری دەکەن

preparates Hormon یان شێوەی تێکەڵاو لەم دووانەدا.

- نەشتەرگەری

لە گوونەکاندا هۆرمۆنی پیاوانە Testosterone پێکدێت.
پەرەساندن/ زیادکردنی خانەکانی شێرپەنجە پەیوەستە بەم هۆرمۆنە. بەرێگەی نەشتەرگەری ئەم پارچە/شانەیەی کە ئەم هۆرمۆنە درووست دەکات لە ناو گوونەکاندا هەڵدە گیرێت.
ئەم نەشتەرگەرییە پێی ئەڵێن Subcapsulaire orchidectomy . بەم شێوەیە بەرهەمهێنانی ئەم هۆرمۆنە لە ناو گووندا ڕادەگیردرێت.
ئینجا لە زیادکردن و تەشەنابوونی گرێیەکە بەرگری دەکرێت و ئازاریش کەمتر دەبێتەوە.
ئەمە نەشتەرگەرییەکی ئاسایی و ئاسانە و زیاتر بە سڕکردن لە ڕێگەی پشتەوە دەکرێت. لەم نەشتەرگەرییەدا گوونەکان لە بنەڕەتەوە لێ ناکرێنەوە و هەتا هیچی وای پێوە دیار نابیت کە نەشتەرگەری بۆ کراوە.

- **چارەسەری بە ڕێگەی هۆرمۆن/ Hormonal therapy**

هەندێک دەرمان هە یە کە دەتوانن هۆرمۆنی پیاوانە ڕاگرن. بەم هۆیەوە خانەکانی شێرپەنجە لە زیادکردنیان دەوەستن.
ئەوانە LH-RH analogs & anti-androgens end of Combination
**یەکێک لەم دوو جۆرە دەرمانانە و یان تێکەڵاوی هردوویان.**

**LH-RH analogs**

ئەم دەرمانە کاریگەری هەیە لە سەرئەم گلاندە کە لە ناو مێشکدایە: The Hypofyse .
گلاندی هیپۆفیز هەندێک هۆرمۆن بەرهەم دێنێت،کە گوونەکان ئامادە دەکات بۆ درووست کردنی هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن.
بە دانی دەرمانی LH-RH analogs بەرهەمهێنانی هۆرمۆن لە ناو گلاندی هیپۆفیزدا ڕادەگرن،کە دەبێت بە هۆی ئەوەی کە گوونەکان ئیتر هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن درووست نەکەن.
ئەم دەرمانانە بۆ ماوەی درێژخایەن کاردەکەن و لە ڕێگای دیواری زگەوە لێدەدرێن و بۆ یەک مانگە.
ڕێژەیەکی زۆر و بۆ ماوەی دوور و دریژ بەکار هێنانی ئەم دەرمانە هۆکارێکە بۆ درووستبوونی" پووک بوونی" ئێسکەکان واتە Osteoproses .

- دژە ئاندرۆژینەکان واتە Anti-androgen

ئەم دەرمانانە کارکردنی تێستۆستێرۆن هی ناو گوونەکان وناو گلاندی ئادرێنالین Adrenal gland ،کە لە سەر گوورچیلەکاندایە ڕادەگرێت کە ئەوانیش ئەم هۆرمۆنە درووست دەکەن.
ئەم دەرمانانە پارێزگاری لە شانەکان دەکەن کە هەستیارن بەرامبەر بە هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن.
بەم شێوەیە هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن ئیتر کاریگەری نابێت لە سەر پرۆستات.

**دواکێشەکان بە هۆی چارەسەری هۆرمۆنەکان:**

- کەمبوونەوەی حەزی کردەوەی سێکسی.
- کێشەی ڕەپ بوون.
- هەستی کتوپڕ بە گەرما و هالاو لە جەستەدا دڵەڕاوکێ وەکو ئەو ئاریشانەی کە ئافرەتان تووشی دەبن لە کاتێ ڕاوەستان لە سووڕی مانگانەیان یاخوو(لێچوونەوە لە بێنوێژی) .
- ئازار و ئاوسانی مەمکەکان.

- گۆڕان لە مووە کانی جەستە.
- زوو ماندوو بوون.
- گۆڕان لە دابەشبوونی چەوری جەستە.

- **چارەسەری تێکەڵاو یان وێکڕا واتە Combination therapy**

هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن لە ناو گوونەکان و گلاندی ئەدرێنالین درووست ئەبێت. دوایی نەشتەرگەری Orchidectomy و چارەسەری بە دەرمانی LH-RH analoges تەنیا بەرهەمهێنانی تێستۆستێرۆن لە ناو گوونەکاندا ڕادەگیردرێت.
دەرمانەکانی Anti-androgens کارکردنی هەردوو جۆرە هۆرمۆنەکان ڕادەگرن.
ئینجا بۆیە لە پەنایی نەشتەرگەرییەکەدا یان چارەسەری بە دەرمانی LH-RH analogs هەروەها دەرمانێکی جۆری Anti-androgens یش بدرێت بە نەخۆش.
لە ئەنجامی گۆڕانی ئەو هۆرمۆنانە، لەوانەیە ڕەپبوون کەم ببێتەوە. بەڵام حەز و هەستی سیکسی هەر دەمێنێتەوە. ئەگەر بەرهەمی هۆرمۆنی تێستۆستێرۆن نەما، جاری وایە لەوانەیە هەست بە گەرماییەکی زۆر لە جەستە بکرێت، پەڵەی سوور لە ڕوخسار و گەردن، لێدانی خێرایی دڵ،گرژبوون و ئازار لە گۆیی مەمکەکاندا پەیدا بێت.ئەوە مەترسی ژیانی لە سەر نییە بەڵام ناخۆشە و ئەوەش بە ڕێگەی دەرمان چارەسەرییان دەکرێت.

- **چارەسەری کیمیایی:**

وەک باسمان کرد،نەشتەرگری،لێدانی تیشک و چارەسەری بە هۆرمۆنەکان زیاتر کاری پێ دەکرێت بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات. زۆربەی جۆرەکانی شێرپەنجەی پرۆستات ڕەنگدانەوەیەکی باشیان هەیە بە رامبەر بە چارەسەری بە هۆرمۆنەکان واتە Hormontherapy .

هەر کاتێک کە هۆرمۆنەکان کاریگەرییان نەبێ و نەتواندرێت/نەکرێت تیشک لێبدرێت/ Radiotherapy،
هەندێکجار Chemotherapy واتە چارەسەری کیمیایی ئەنجام ئەدرێت.
چارەسەری کیمیایی دابەشبوون و خۆکۆپی کردنی خانەکانی شێرپەنجە ڕادەگرێت.ئەم چارەسەری کیمیاییە بۆ مەبەستی ئەوەیە کە کیمیایی خۆی بگەیێنێتە سەرتاسەری جەستە بۆ دژ بە ئەو خانەشێرپەنجەئیانەی کە لەوانەیە پەلییان هاویشتبێت.
بە ڕێگەی Chemotherapy نەخۆشییەکە بۆ ماوەیەکی کوورت یان درێژ ڕادەگیردرێت و کێشە و ئازاریش کەمتر
دەبێتەوە.
ئەو دەرمانانەی کە دابەشبوونی خانەکان ڕادەگرن واتە Cytostatica زیاتر بەڕیگەی سۆندەیەک لە ناو خوێنهێنەرێکرا Infusion بە جەستە دەگەیەندرێت. هەندێک لەم دەرمانانە ش بە شێوەی حەب بەکار دێن.
لێدانی ئەم دەرمانە چەند کاتژمێرێک دەخایەنێت و نەخۆش پێویست ناکات شەو لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە.
Cytostatica نە تەنیا خانەشێرپەنجەییەکان لە ناو دەبات بەڵکو زیان دەگەیەنێت بە خانە باشەکانیش.

**دواکێشەکان دوایی چارەسەری کیمیایی**

- هەڵوەرینی قژ/پرچ
- ئێڵنجهاتن/دڵتێکهەڵاتن و ڕشانەوە
- تێکچوونی ڕیخۆڵەکان
- کەمبوونەوەیی خڕۆڵکەکانی سپی ناو خوێنLymphocyte کە بەم هۆیەوە نەخۆش زووتر ئامادەیە بۆ تووشبوون بە " هەو کردن" واتا Infections .
- زوو ماندووبوون
- گۆڕانکاری لە پێست، نینۆک، وەکو خورران(ئالۆش)، پێستی ووشک و نینۆکی ناسک و قەڵشیو.

لەمکاتەدا زۆر دەرمانی بەسوود هەن بۆ بەرگریکردن لە دڵتێکهەڵاتن و ڕشانەوە. ئەم دواکێشانە دوایی چارەسەرییەک لە خۆیانەوە دەڕۆن.

**چارەسەرییەکانی تر:**

ئەگەر هاتوو شێرپەنجەکە پەلی هاویشتبوو لە ئێسکەکاندا واتە بڵاو بووبێتەوە، ئەوە دەبێتە هۆی ناسکبوونی پەیکەری مرۆڤ واتە ئیسکەلە.ئەوەش دەبێتە هۆی ئازار و ئەگەریش زۆرە کە زووتر ئیسک بشکێت. دەرمانی جۆری بیسفۆسفۆناتەکان پێکهاتەیەکن کە توانایان هەیە ئەم پرۆسەیە تا ڕادەیەک ڕابگرن تاکو بەرگری لە ناسکبوونی ئیسکەلە بکەن. ئەم چارەسەرییە ئەدرێت کاتێک کە چارەسەری بە ڕێگەی هۆرمۆنەکان ڕەنگدانەوە یاخود کەڵکی نەبێت و یان لەم حاڵەتانەی کە چارەسەری کیمیایی گوونجاو نەبێت. ئەم چارەسەرییە تەنیا بۆ ڕاگرتنی نەخۆشییەکەیە و چارەسەری بنەڕەتی نییە.

**کێشەی بەدخۆراکی و ماندوویی**

دەرمانی پرێدنیزۆلۆن، جاریوایە کەڵکی لێوەردەگیردرێت بۆ چارەسەری کێشەی بەدخۆراکی و ماندووبوون.

**لەوانەیە ئەم دواکێشانەی پێوە بێت:**

- ڕووخسارێکی خڕ و پڕ شێوەی مانگی تەواو و ڕوومەتەکان ئاڵن
- پێستێکی ناسک/ تەنک کە زوو دەڕووشێت
- پەیدابوونی نەخۆشی شەکرە یان ئەگەر هەیبێت، شەکرەکەی بە کێشەتر دەبێت
- ئێسکی ناسک و کەم توانا
- گرێ یان برینی گەدە

**زانست و چارەسەری نوێ بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات:**

بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات ئێستا کاری زۆری بۆ دەکرێت و مرۆڤ بەردەوام لە داهێناندایە. لەم دواییەدا دوو شیوە چارەسەری نوێ کاری پێدەکرێت بەڵام تا ئێستا نەبۆتە شیوازیکی ڕۆتین و ڕۆژانە و یان لە هەموو شوێنێکدا ئەو هەل و مەرجەی نەڕەخساوە کە کەڵکی لێوە وەربگیردرێت.

ئەم دوو ڕێگە چارەسەرییە چارەسەری کریۆتراپیCryotherapy و هایفوتراپی HIFU therapyیە. لە بارەی ئەم دوو تەکنیکە جارێک لە توێژینەوەیدایە کە ئایا تا چی ڕادەیەک ئەم دوو ڕێگە چارەسەرییە دەتوانن چارەسەری بنەڕەتی شێرپەنجەی پرۆستات بکەن.

**کریۆتراپی:**
لەم تەنیکەدا بە ڕێگەی سرکردن چەندین دەرزی لە نێوان گوونەکان و کۆمەوە لە پرۆستات ئەدرێت کە دواتر بەستەڵەک دەکرین. بە ڕێگەی بەستەڵەککردنی بەستەرە شانەی پرۆستات، هەوڵ ئەدرێت کە خانەکانی شێرپەنجەیی پرۆستات لە ناو ببەن. دواکێشەی ئەم تەکنیکە ئەوەیە کە پیاو ئەگەری زۆرە کە ئاریشەی ڕەپبوونی هەبێت.

**هایفوتراپی:**
بە ڕێگەی ئەم تەکنیکەدا و بە سرکردن بە ڕێگەی کۆتایی ڕیخۆڵەی گەورەوە بە سۆندەیەکی نەرم کە دەچەمێتەوە و بە شەپۆلەکانی دەنگ کار دەکات، دەبرێتە ناو پرۆستات.ئەم شەپۆلە دەنگانە بەستەرە شانەی پرۆستات بە لەرزە دێنن. بە م هۆیەوە گەرمایەک دروست دەبێت و بەم گەرمایە خانەکانی شێرپەنجەیی لە ناو دەچن.
دواکێشەی ئەم میتۆدە  ئەوەیە کە ئاریشەی میزکردن و میزڕاگرتنی پێوەیە.

- **ڕەچاوکردنی ئەو خاڵانە کە پەیوەستن بە کێشەی میزکردن**
- ئاو زۆر بخۆوە بەڵام لە نەکو لە یەک کاتدا.
- میزدۆ بەتاڵ/ خاڵی بکە بە کاتی خۆی: بۆ نموونە هەر 3 کاتژمێر جارێک.
- پارێز لە خواردنەوەیی خواردنەوەکانی ئەلکهولی بکە،قاوە،خواردنەی زۆر قورس،گژ وگیایی تووند و تیژ.
- پارێز (هەتا بکرێت) لە ئاڵۆزی دەروونی و سەرما بکە.
- هەوڵ بدە بە ڕێک و پێکی ڕۆژانە بچیتە سەر ئاودەست و پیسایی بکە.
- هەوڵ بدە جوڵەت زۆر بێت(وەرزش بکە).

- **شێوەی ژیان و خۆراک**

هەندێک سەرچاوی زانیاری هەن و سەلماندراوە کە خۆراک ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پەیدابوونی نەخۆشییەکانی پرۆستات وەک شێرپەنجە.
لە پاڵ خۆراکی ساغ و گوونجاو هەروەها شێوازی ژیانی تەندروست تا ڕادەیەک ئەتوانێت بەرگری بکات لە تووشبوون بە شێرپەنجە.
**ژیانی تەندروست مانایی ئەوەیە کە مرۆڤ:**
- جگەرە نەکێشێت؛
- خواردنەوەیی ئەلکهولی( مەی) نەخواتەوە و یان زیادەڕەوی نەکات؛
- مادده بێهۆش/سرکەرەکان بە کار نەهێنێت؛
- جۆڵانەوەیی ڕۆژانە یان وەرزش بکات؛
- تیشک و ڕوناکی بە تایبەتی ڕۆژانە بە لانی کەمەوە کاتژمێرێک هەوای ئازاد وەرگرێت؛
- لە قەلەوبوون خۆی بپارێزێت/ کالۆرییەکان کەم بکاتەوە؛
- دووری بکات لە گرژی و ئاڵۆزی و شڵەژانی دەروونی؛
- ڕۆژانە کات و ساتێک تەنیایی و بێدەنگی هەبێت بۆ ئارامکردنەوەیی ڕۆحی خۆی.

**خۆراکی تەندروست ئەوەیە کە مرۆڤ:**

- ڕۆژانە  تا ڕادەیەکی باش(200 ) گرام سەوزەوات بخوات؛
- ڕۆژانە بە لانی کەمەوە دوو دانە میوە بخوات؛
- بە ڕێژەیەکی باش خۆراک وەکو نان،ساوار،برنج...؛
- ڕێژەیەکی "کەم" بەکارهێنانی خوێ و شەکر؛
- ڕێژەیەکی "کەم" بە کار هێنانی چەوری ئاژەڵ؛
- تا ڕادەیەکی باش بە کارهێنانی چەوری گیایی،ماسی،زەیتوون و ڕۆنی سۆیا؛
- پارێز کردن لە خواردنی گۆشتی سوور، باشتروایە  زیاتر گۆشتی ماسی و یان باڵەندەکان و هەروەها  خواردنی فاسۆلییا و نۆک و نیسک.....

**لە پەنا ئەوەدا هەندێک پەند و پێشنیاری تایبەت هەیە بۆ کەسانێک کە  نەخۆشی شێرپەنجەی پرۆستاتیان هەیە:**

- خواردنی تەماتە بە تایبەت بە کوڵاوی یان سوورکراوە؛
- گێزەری نەکوڵاو؛
- خۆراکی سۆیا؛
- ئە گەر خواردنەوەی ئەلکهول بە کار دێنیت باشتر وایە  شەرابی سوور هەڵبژێریت؛
- چایی سەوز(گریین تی)
- بەکارهێنانی هەندێک جۆرحەبی مۆڵتیڤێتامینەکان-کانزاییەکان ( Selenium,Calicum,Vit E ,Vit D ).

**زارگووتە چەوتەکان:**

- وانییە کە ئەڵێن گەورەبوونی پرۆستات یان شێرپەنجەی پرۆستات بە هۆی دەستپەڕکردن و یان هەر کردەوەیەکی تری سێکسی بێت.
- شێرپەنجە تەنینەوەی نییە،ئینجا شێرپەنجەیی پرۆستاتیش هەروەها نییەتی.شێرپەنجە نەخۆشییەکی پیس و مەترسیدار نییە بۆ کەسانی دەورووبەرو.
- وانییە کە ئەڵێن دوایی نەشتەرگەری کە پرۆستات هەڵگیردرا مرۆڤ کێشەی سێکسی بۆ پەیدا ئەبێ.ئەم کێشەیە جاری وایە دێتە ئاراوە.
- وانییە کە ئەڵێن دوایی نەشتەرگەری پرۆستات (هەڵگرتنی) مرۆڤ میز لەخۆیدا ناتوانێ ڕابگرێت،بەڵام ئەوەش پەیوەستە بە هەندێک فاکتۆر و لە هەندێک پیاودا جیاوازە.
- وانییە کە ئەڵێن شێرپەنجەی پرۆستات درووست ئەبێت دوایی خۆبەستن(پیاوان ئەتوانن خۆیان ببەستن بۆ مەبەستی بەرگری لە کاریی زاییندەیی) Sterilization ( Vasectomy ).
- بە هیچ شێوەک گژوگیای دەرمان سوودی نییە بۆ چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستات و نەخۆشییەکانی پرۆستات.

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەیین کە لە حاڵەتی شێرپەنجەی پرۆستاتدا ئاستتەنگە بگووترێت کە نەخۆشییەکە بە تەواوی چارەسەر دەکرێت یان تووشبوو بە تەواوی چارەسەر کراوە دوایی وەرگرتنی سەرجەم ئەو ڕێگە چارانەی کە بۆی ئەنجام دراوە، چۆنکە جاریوایە بە چاوەڕێ نەکراوی نەخۆشییەکەی دەگەڕێتەوە.

لە تەواوی ئەو پیاوانەی کە چارەسەرییان بۆدەکرێت، ٨٠% یان باشتر دەبنەوە و ماوەی لە ژیاندامانەوەیان نزیکەی ٥ساڵە بە مەرجێک شیرپەنجەکە پەلی نەهاویشتبێت.
گەڕانەوەی نەخۆشییەکە، پەیوەستیشە بە جۆری شێرپەنجە و جۆری چارەسەری و هەندێک فاکتەری تر و لە هەندێک کەسەوە تا کەسێکی تر لەوانەیە جیاوازی هەبێت.

پرسیار یان گوومانت هەیە لە سەر ئەم زانیارییانەی سەرەوە، پەیوەندی بکە بە پزیشکێکی پسپۆر لەم بابەتەدا
یان ڕاوێژ بکە بە سەنتەری پەنا بۆ پشتیوانی لە تووشبووان بە شێرپەنجە لە کوردستان.

Facebook:Penapenacenter
E- mail:pena-center@hotmail.com
Mobile:(00964)0750.368 37 44
www.penacenter.com

سەرچاوەکان:

1- www.prostaat.nl
2- www.urolog.nl
3- www.kwfkankerbestrijding.nl (Folder: Prostaat kanker)
4- HET PROSTAAT BOEK IBSN:90-8523-069-1